**داوەتی گوڵ**

عەلی سەلیمی بابامیری «پەشێو»

شێعر

چاپی هەوەڵ

ویراستار: ئەمیر رەمەزانی «ئاڵەشین»

پیتچن:




رووبەرگ:

لە سەر ئەرکی نادر نیروومەند «بۆران» چاپ کراوە

# پێشەکی

ماوەی دە ساڵە چاوەڕوانین بەرهەمی مامۆستا عەلی سەلیمی بابامیری (پەشێو ) چاپ بکرێ و بگاتە دەس لایەنگرانی ئەدەبیاتی کوردی و شێعری مامۆستا. بەڵام بە داخەوە جەنابی موحەممەدی کتێب فرۆشی سەقز هەر ئەمڕۆ بۆ سبەینێی پێ دەکا و هەر تاوێ بە بیانوویەکەوە خۆی لێ دەبوێرێ. پێمان وایە هەر بۆیە کە مامۆستا پەشێو ئیمتیازی کۆمەڵێک لە شێعرەکانی بە ناوی «پەلکەزێڕین» داوە بەو کابرایە و هیچ پوولێک (حق التالیف)ی لێ وەرنەگرتووە، دەنا دە ساڵ و چاپ ( ؟!) کە ئەویش لەو ماوەیەدا دەیان و بگرە سەتانیش کتێب لە چاپ دراون کە تەنانەت پیت چنینیشیان دوای ئەو بەرهەمەی «پەشێو» بووە.

ئێمە کە لە نزیکەوە مامۆستا پەشێو دەناسین دەزانین ئەگەرچی هەژار و دەسکورتە، بەڵام پلەی هیممەتی لە حەو تەبەقەی ئاسمانیش تێپەڕیوە. بۆیە هاتووین کۆمەڵێکی بچووکمان لە شێعرەکانی ــ کە لە گەڵ بەرهەمی «پەلکەزێڕین» جیاوازە و رەنگە بەشێک لە چوار بەشی شێعرەکانی بێ ــ لە ژێر ناوی . . . . . ــ چاپ کردووە. ئامانجیشمان هەر ئەوەیە کە هۆنراوەکانی بگاتە دەس لایەنگران و چیدی چاوەڕوان نەبن.

هیواداریین بتوانین لە داهاتوویەکی نزیکدا کۆمەڵەی بەرهەمەکانی بە گشتی لە چاپ دەین.

نادر نیروومەند «بۆران»

ئەمیر رەمەزانی «ئاڵەشین»

بەهاری ١٣٨٢

«با لە نێو مەزرای خەیاڵی سەوزی تۆ بخولێمەوە
تا خەیاڵ مەستم بکا بۆ ژوانی شێعرت دێمەوە» «ئاڵەشین»

بە بڕوای من هۆنراوەکانی مامۆستا «پەشێو» لە گەڵ شاعیرانی دیکە جیاوزییەکی تایبەتی هەیە. هەر ئەوەی کە مامۆستا عەلی خان بە زاراوەی موکریانی بە تایبەت زاراوەی بەشی فەیزوڵڵابەگی شێعرەکانی هۆنیوەتەوە زوو جێی سەرنجە و تام و چێژێکی تایبەتیان هەیە. لەم رستانە بڕوانن: «بەڵا داخی گرانم دێ / لە دیمەن هەر کەس ئەڕوانی/ ئەڵێم شێعرێ بڵێم/ زوو کە بێرۆ / بنۆشی لی کە یەک ژەم / ئەوێسم / رەگ و پێس و چەقی ماوە» ئینجا ئەم وشانە: «زۆسان، بەلامۆ، پی لاچێ، بلەرزێنۆ و هتد«. بیستنی ئەم وشانە هەر لە زاری خەڵکی ناوچەی ناوبراو خۆشە. ئەو جار هەستی ناسکی مامۆستا لە پەسن نایە جوانی شێعرەکانی جگە لە سنعاتی شێعری (صنایع ادبی) لەوەدایە کە مامۆستا لاوی داوێنی چیایە و بۆنی گوڵ بێشکەی ئەوە. هەر کات ناوی گوڵ لە شێعرەکانیدا دەبیستی من پێم وایە بۆنی گوڵەکەش هەست دەکەی. چا چەندە مامۆستایانە ئەم وشانە رستە کراون؟! دەبێ مامۆستایان باشی بزانن؟! کاتێ بیزا بە شانەی سروە دادێنێ قژی یان گوڵی مێلاقە لێوی سوور دەکا بۆ دڵگەزین، یان دەبینی فەلەک تەونی بە شانەی بارشی کردووە و لە هەموو جۆر گوڵی جوان و رازاوەی لەم تەونەدا چنیوە، وەک: نەرگس، نەسرین، مینا، ماستاو، سێوەرە، بیزا، مەنێ، مێلاقە، شلێرە، خاشخاشە، شەوبۆ، چنوور، گەزیزە، وەنەوشە و هتد» لەو کاتانەدا هەستی ناسکی عەلی خان ئاوێتەی غەزەل و مەسنەوی و . . . دەبێ. سەیر لەوەدایە لە هونەری نەقاشی و مووسیقیدا ئەوەندە شارەزا مەبەستی دەربڕیوە، لات وابێ خۆی مامۆستای ئەم هونەرانەیشە:

تێکەڵـــــــی دەنگـــــــی شەماڵــــــێ دێتــــــە گـــــــوێی خــــــاوەن دڵــــــان
ســــــازی پاســــــاری بــــــە نــــــەزمی زایەڵــــــەی پاســــــارە دێ
ســــــۆزی فیتــــــەی جۆربــــــەجۆری ســــــەد مــــــەقامی ســــــێرووە
کــــــۆڕی مۆســــــیقای سروشــــــتە یــــــا لــــــە تێلــــــی تــــــارە دێ؟



دەڵـــــێن مـــــانی کـــــە مەشـــــهوورە لـــــە بـــــاوەڕ کـــــردنم دوورە
بەســـــانی دیمـــــەنی چـــــاوی لـــــە نەخـــــشاوی ئەســـــەریا بـــــێ
دەڵـــــێی نـــــووکی ئـــــەڕاراتن بـــــە تـــــۆزی مـــــش بـــــڕازێنۆ
لـــــە ســـــەر ســـــینگی مەمـــــەی بـــــەفری کراســـــی شـــــەو لـــــە بـــــەریا بـــــێ
وە یـــــا کاتـــــێ بلـــــەرزێنۆ لـــــە ژێـــــر ناســـــک کراســـــیدا
لـــــەرەی بـــــەدری شـــــەوی ســـــاوە لـــــە ســـــەر ئـــــەمواجی دەریـــــا بـــــێ



ئەمنیش لە باوەڕ کردنم دوورە کەسێ توانیبێتی ئەوەندە رازاوە ئەو دیمەنانە و ئەم سروشت و خۆ کردەی کوردەواری نەقاشی بکا. ئەم تابلۆ جوانانە! خۆ نازانم کامەیان باس بکەم؟! ماچی تیشکی تاوی دەم بەیانی لە سەر لێوی گوڵان، هەڵپەڕکێی بووکی گەزیزە و گوڵانی تر لە داوێنی چیا، چاو هەڵێنانی بەیان؟! لە راستیدا هەر کامەیان فیلمێکە لە بەر زەینی خوێنەر. ئەویش چتۆ فیلمێک:

لەرەی مەمکی خزەی نەرمی شەپۆلە　　　گوڵی ماچن بەسەر سینگی شەتاوا

وەکوو کلچێوە، خۆزگا چاوەکانم　　　کەشێ دەکشا بە چاوی راکشاوا

بۆچی شەتاوی هێناوە؟ چونکا شەتاو مەندە و شەپۆلەکانی نەرمن وەکوو ئاوی دەریا شەپۆلی توند و بەگوڕ نیە. ئەمەش وردبینی ئەو شاعیرە دەگەیێنێ. بەڵام مامۆستا لە مەقامی تەوازوعدا دەفەرمێ: (تەونی ئاڵۆزی «پەشێو»ە نەخشی وا ساکارە دێ).

کورد گوتەنی: وەرن لە دین لا مەدەن ئەم تەونانە ساکارن؟ یان شاکارن؟!

بەڵام تۆخودا لە باری ئەویندارییەوە لۆمەی شاعیر مەکەن لێی گەڕێن ئەو شاعیرە بێچارەیەی لە نێو ناخیدا خەم میر و سەرۆکە و قەوەی مۆتەی هاتۆتە سەر سینگ و بەرۆکی با بۆ پشوو جارێکیش لە شار دەرچێ و کیژی هەڵبەستی ئەوینی بۆ بچێتە ژوانێ و با باڵی پەپوولە باوەشێنی سۆسەن بێت و بولبولی مەست و بزۆز و دڵتەڕ و هەرزەکاریش گوڵی عازەبی شارەزای ماچی ژوانی بدۆزێتەوە و بەژنی وەنەوشەش بکەوێتە ئامێزی پەشێوەوە، بەڵکوو ئەو خەمە میر و سەرۆکە بنێژێ و «ئۆخەی بەهاری بلێ»!!

دەفەرمێ: «من ئەوەی جوانن خودا لەودا دەبینم . . . . جا دەڵێم . . . » بەڵام پێشی وایە بیری شاعیر تێدەڕووخێ ئەگەرخاڵی کچ پاکڵ نەبێ. ئینجا ئێوە بڵێن کاتێ غەزەل مەست بێ! شاعیری بێچارە چۆن مەست و ئەویندار نابێ؟ ئەویش بە تایبەت کە بدینێ بولبول بە زاری گوڵ مەی بچێژێ!!!

گرینگ لە شێعری مامۆستا پەشێودا ئەوەیە کە بە پێچەوانەی شاعیرانی هاوتەمەنی خۆی وشەی نامۆی (فارسی و عەرەوی) لە شێعرەکانیدا زۆر کەم هێناوە و تا توانیویە لە وشەی کوردی کەڵکی وەرگرتووە. جا بۆیە پێم وایە بەرهەمی ئەم «پەشێو»ەش گەنجێکە و دۆزیومانەتەوە بۆ خەزێنەی ئەدەبیاتی گەلەکەمان.

ئەمیر رەمەزانی «ئاڵەشین»

بەهاری ١٣٨٢ ـ بۆکان

به ناوی خوای ئەوین و جوانی کە هەموو شتێکی لە نەبوونەوە هێناوەتەدی.
سڵاوێک وەکوو بۆن و بەرامەی خۆش و رەنگی گوڵەکانی کوێستانی کوردستان پێشکەش بە ئێوە ئەدەبدۆستان و لایەنگرانی ئەدەبی کوردی.
لە سەر ئیزنی ئێوە وام پێباشە بە دوای وشەدا نەگەڕێم بۆ ئەم مەبەستە، تا نووسراوەکەمی پێبڕازێنمەوە. ئەگەر بمهەوێ رووداوی گرینگی ژیانم بنووسم جگە لە بڕێک خۆشی، ئاڵۆزیەکانی خۆی بە تەنیا کتێبێکی گەورەیە. جا لە بەر ئەوە چاوی لێدەقووچێنم و کورت و کرمانجی خۆکتان پێدەناسێنم:
ئەمن عەلی سەلیمی بابامیری کوڕی «محەممەد حوسێنخان» و دایکیشم «مەعسوومە خانم» بووە و لە هۆزی «فەیزوڵڵابەگی»م. لە ساڵی ١٣١٦ی هەتاوی لە گوندێکی چکۆلەی بەشی سەقز لە نێوان رووباری «ساروخ» و «جەخەتوو» بە ناوی «قاشوخ» هاتوومەتە دنیاوە. لە تەمەنی ٩ ساڵیدا بابم بە رەحمەتی خودا چووە و بە هەتیوی گەورە بووم. لە کن مەلا و میرزای ئەو سەردەمە کەمێکم دەرس خوێندووە. جا بۆیە کەمیش دەزانم. لە ساڵی ٤٤ی هەتاوییەوە دەستم بە نووسینی هەڵبەست کرد و نازناوی «پەشێو»م بۆ خۆم هەڵبژارد.
لێرەدا بە پێویستی دەزانم «مامۆستا عەبباسی حەقیقی» مامۆستای بەڕێز و خۆشەویستمان کە لە سەردەمی پیری و بێتاقەتیدا کاتی خۆی داوە بە گوێ راگرتن و هەڵسەنگاندنی ئەم هەڵبەستانە، پاش سپاسێکی زۆر، داوای لێبوردنیان لێبکەم.
برای بەڕێزیشم «کاک سەعیدی نەجاڕی، ئاسۆ» کە لە زانستی کەڵکم وەرگرتووە و رێنوێنی کردووم و کاک «موزەففەری بابامیری، هەژان» کە پێویستی بە ناساندنی من نیە و زۆر کەس باشی دەناسن، بۆ نووسینەوەی هەڵبەستەکان یاریدەی داوم و هەروەها قوتابی بەڕێز و گەنجی دڵپاکم کاک «ئەمیر رەمەزانی» کە ئەویش شاعیرە و زۆریش ناسک بینە و خەتەکەیشی لە خۆی جوانترە بەو خەتە خۆشەی خۆی زۆربەی هەڵبەستەکانی بۆ نووسیوم. ئەم بەڕێزانە کە ناوم بردن زۆریان سپاس دەکەم و هیوادارم لە ژیاندا سەرکەوتوو بن و بۆ یارمەتی بە ئەدەبدۆستانی گەلەکەمان هەر وا تێکۆشەر بمێننەوە.

پەشێو- ١٣٧٣/٣/٢٨- بۆکان

# دەنگ

شـــەپۆلی خـــوێنی ئەســـرینم لـــە نێـــو کاڵانەیـــە ئەمشـــەو
دەروونی کەیلـــە دەیـــڕێژێ پەڵـــەی بارانەیـــە ئەمشـــەو

دەبیســـم ســـۆزی ناســـازێ،دەپرســـم کێیـــە ئـــەو دەنگـــە؟
دەڵـــێن پیرێکـــە میـــوانی گوڵـــی وێرانەیـــە ئەمشـــەو

قسەی چیرۆکی ئەشـقی مـن لـە گـەڵ ئـەو چـاوە نەرمانـە
لـــە مێـــژە تاڵـــی ئاڵـــۆزەو قـــژی بـــێ شـــانەیە ئەمشـــەو

گەلێ مەشهوورە ئـەم باسـە، قسـەی مەسـتی دەڵـێن راسـە
ئـــەوینی مـــن شـــەپۆلێکە و قســـەی مەســـتانەیە ئەمشـــەو

دەزانم تـــۆ دەســـووتێنی پەڕوباڵـــی پەپوولـــەی دڵ
بەڵـــا چ بکـــەم لـــە دەوری شـــەم پـــەڕی پەروانەیـــە ئەمشـــەو

وەرە بـــا دڵ بگۆڕینـــۆ بـــە خێـــری دەرفـــەتی ئەمـــڕۆ
ئەوەی دوێنێ کـــە رابـــوورا هـــەمووی ئەفســـانەیە ئەمشـــەو

شەرابی سووری لێ دەڕژێ دەبێ ماچی کـەم ئـەو لێـوەت
کەسێ پرسی تەقەی چـی بـوو دەڵـێم پەیمانەیـە ئەمشـەو

لە ئـەقڵ و ئاقڵـی مـەدوێن لـە گـەڵ ئاشـق دەڵـێن شـێتن
کە وا بوو کەس نەڵێ بۆچی «پەشـێو» دێوانەیـە ئەمشـەو

## بەرجەوەند

کەنگێ بولبول دێتە ویتە تا دڵی پڕ گوڵ نەبێ
تا چەمەن بەفری نەڕووخێ تا چیا پڵ پڵ نەبێ

کاتێ مێلاقە و شلێرە دەیخنن باخەڵ بەهار
حەیفە دڵداری گەزیزە شاگوڵی سەرچڵ نەبێ

چەندە خۆشە مەل بخوێنێ تۆش لە نێو کۆڕی گوڵان
دەستی دڵدارت لە دەسدا هەر بڕۆی مەنزڵ نەبێ

زۆر کەڕەت بیرم لە ئەسپی گەی گری ژین کردەوە
وا نەبوو جارێ نەوەستێ پەل نەخات و سڵ نەبێ

بۆ بژیو زێدم بە جێ ما وا بە هیوام بێمەوە
گەر ئەجەل ماوەم بداتێ کۆچی ئاو و گڵ نەبێ

پێم دەڵێن پیر و کەنەفتی باسی کیژ و گوڵ مەکە
با نەڵێن شاعر نەزانە وێ دەچێ ئاقڵ نەبی

من ئەوەی جوانن خودا لەودا دەبینم جا دەڵێم
هەستی شاعیر تێدەڕووخێ خاڵی کچ پاکڵ نەبێ

لاوی داوێنی چیام بۆنی گوڵ بێشکەی منە
خۆشەویستی مافی ژینە بۆ کەسێ بێدڵ نەبێ

تا بەهاری کوردەواری بۆم نەبێتە بەرجەوەند
کوا «پەشێو» هەستی دەجوولێ باوەشی پڕ گوڵ نەبێ

# باڵی پەپوولە

ئەو دەمەی گوڵ دێتە شوێنم بۆ پشوو دەرچم لە شار
کیژی هەڵبەستی ئەوینێ بۆ ژوانم دێتە بار

ئەو دەمەی پەنجەی نەسیمێ لادەدا بسکی چنوور
یا کزەی نەرمی بەیانی بادەدا گوارەی چنار

ئەو دەمەی بیزا بە شانەی سروە دادێنێ قژی
یا مەنێ بۆنی هەناسەی کەوتە بەستێنی هەوار

کاتێ هەڵدەزنێ چیا بۆ باوەشی نەرمی هەتاو
یا لە بەر شەرمی شلێرە سوور دەبێ کوڵمەی نسار

یا گوڵی مێلاقە کوڵمی سوور دەکا بۆ دڵ گەزین
بۆ گەزین و هەڵمژینی بیری گەستم لێوی یار

ئەو دەمەی گوڵ عازەبێکە شارەزای ماچی ژوان
بولبولیش مەست و بزۆزە و دڵتەڕێکی هەرزەکار

ئەو دەمەی باڵی پەپوولە باوەشێنی سۆسەنە
سۆسەنیش هەستی پەپوولە راپەڕێنێ جاروبار

ئەو دەمەی بەژنی وەنەوشە کەوتە ئامێزی «پەشێو»
لەو دەمەیدا خەم دەنێژم جا دەڵێم ئۆخەی بەهار!

# شەرت

شەرتە ئیدی تاکو ماوم قەت هەڵە و سەرچڵ نەبم
داوی خاوی راوی چاوی شۆخی سرک و سڵ نەبم

تا دڵی قەندیلی تەزبێ بۆ دڵم ئاگر نەبێ
بەفری کوێستانی تەزی بم قەت شەرارەی کڵ نەبم

یا کەسێ قەدری نەزانێ بیتەزێنێ هەستی من
هەروەکوو شەختەی دڵی بم قوڵتی گەرمی کوڵ نەبم

شەرتە لەو باغەی کە بولبول رێزی کەمتر بێ لە قەل
چێژی بێ رێزی نەچێژم بۆ سەفا ماتڵ نەبم

یا گوڵی ئیلهامی شێعرم تەڕ نەبێ تەڕ کا غەزەل
روو لە چیمەن وەربگێڕم شێعری تەڕ بۆ گوڵ نەبم

ئەو دڵەی هۆدەی ئەوینم دەیکوژم ئاسوودە بێ
تا جەفا پیشەی گوڵانە، با زەلیلی دڵ نەبم

چەنـدە خۆشـە گـەر بەتانـەم پـێ نەڵـێن: بـۆ وا دەڵـێ؟
دیمـــەنی شـــێت و خولـــێ بم ســـێبەری ئـــاقڵ نـــەبم

بـا نـــەزانم دەســتی بــەربینم لــە دەســتی دۆس ئــەچێ
تـا بـە هێـزی دەسـتی تۆڵـە بـۆ گـەرووی مـێمڵ نـەبم

کوا کەسێ چەشنی «پەشێو» بێـت و بڵـێ راسـیش بکـا؟!
شـەرتە نـەمتوانی گوڵـێ بم، وەک دڕووی پێکـوڵ نـەبم

١٣٧٢/٥/٤
بۆکان

# گەڕی گەردوون

مـــەلی بـــەختم شـــکا باڵـــی لـــە تـــاوا
لـــە تـــاوی خۆزیـــەکـــانی تـــێ شـــکاوا
هـــەتا ژیـــنم گـــوزاری دێتـــە بـــیرم
قـــەتاری خـــەم گـــلاری دێ بـــا چـــاوا
دەسی ئەم چەرخە چەپ گێڕەی گـەوج کـرێ
مـــەلی ژیـــری گـــەلێ بـــادا لـــە داوا
گەڕی گـەردوون لـە بـووکی ناحـەزی خـەم
مـــنی جـــوانی پەرســـتی کـــردە زاوا
شـــەوی بـــەختم بـــەجێ دێڵـــێ خـــەیاڵم
دەســی دێنــێ بــە ســەر بســکی هــەتاوا
وەنەوشـــەی تـــازە پشـــکوتی هـــەوارێ
شـــەپۆلێ کـــە لـــە شـــێعری دارژاوە
لـــەری مـــەمکی خـــزەی نـــەرمی شـــەپۆلە
گوڵـــی مـــاچن بـــە ســـەر ســـینگی شـــەتاوا

وەکــوو کـــل چێــوە خۆزگــا چاوەکــانم
کەشـــێ دەکشــا بـــە چــاوی راکشــاوا
دەبــا لێــوم بــە لــۆی بســکت گــرێ دەم
بـــە ئـــەستۆی ناســکی پــەرژین کــراوا
وەرە چێـــژی گوڵـــی لێـــوت بچێـــژم
نـــەما تـــاوم لـــە تـــاوی نـــاوبراوا
پــەری شــێعری ئــەمن زینــدوو دەمێنــێ
وەکـــو عـــوزرا لـــە مێـــژوی بەربڵـــاوا
«پەشــێو» قــەدری بــەهار و گــوڵ دەزانــێ
کـــەوا رێـــزی گوڵـــی نـــادا بـــە ئـــاوا

بۆکان ـ هاوینی ١٣٧٦

# سۆزی مەل

هەور و باران و هەتاوە ڕۆژ دریژە بێرەوە
وا بەهارە لەم هەوارە خەم بنێژە بێرەوە

سۆزی مەل سازی بەهارە و کۆڕی گوڵ قیبلەی ئەوین
سەوزەڵانی خانەقایە و کاتی نوێژە بێرەوە

کیژی گوڵ مەیگێڕی هەستە و شیوی کانی جێژوان
شێعری دڵداری شەڕابە و لێی بچێژە بێرەوە

چاوی تۆ گێژاوی ئەشقە و هەر کەسێکی تێکەوێ
یا دەخنکێ یا وەکوو من کاس و گێژە بێرەوە

شەوگەڕی بیر و خەیاڵم لی دەهاڵێ بسکی تۆ
بۆ ژوان و چاوەبڕکێ چاو بڕێژە بێرەوە

سەردەمێکە بۆ دەهاوێی تیری تەفرەی بێ ژومار؟
بۆ خوا بەو تیرە جەرگم دامەبێژە بێرەوە

شێعری پاراوی بەهارم دێمە کۆشی خۆشی تۆ
تۆ گوڵی پاراوی شێعرم هەڵمەڕێژە بێرەوە

گوڵ کە ئێخەی ئاوەڵا بێ خۆشەویستە بۆ «پەشێو»
سا گەزیزە بەو گوڵاڵە گێژە بێژە بێرەوە

١٣٧٧/١/٢٠ ـ بۆکان

# گزەی پایز

کزەی پایز کزی تۆرانە ئەمشەو
تەزی کەوتەی خولی زۆرانە ئەمشەو

لە مەڵبەندی بەزیویدا بە زاڵی
خولی زاڵی قولی بۆرانە ئەمشەو

کەفی لرفەی لچ و سیپاڵی زۆسان
گلی ژان و جلی دارانە ئەمشەو

دەوەن کوورە و سەری کاسی چەپۆکە
خەشی بەفر و تەزی میوانە ئەمشەو

دەر و دەشتی خنی تۆزی کرێوە
پشووی زاری زەوی دەرمانە ئەمشەو

لەپی بارن تەپ و تۆزی دەپێوێ
پەسیو مشت و مەنی پێوانە ئەمشەو

دژی ماچی شەت و لێوی هەسارە
مژێ پەردە و تەمی نێوانە ئەمشەو

سەهۆڵی سڕ بزەی روباری تاسان
خورەی ماتە و کزی دامانە ئەمشەو

گەرووی دەنگی وتاری مەل چڕەی چوو
چپەی لاڵە و زمان ئامانە ئەمشەو

قەڵەم لاقی شکا باڵی تەزیوە
تەکان و راپەڕینی ژانە ئەمشەو

بەڵا هەرچەندە زستانە و مژ و تەم
حەزی هەستم لە گەڵ نەیسانە ئەمشەو

گەڕی سەخڵەت لەشی بیری تەزانم
شنەی مەیلم بەرەو ئارانە ئەمشەو

لە ئاسۆ دێتە گوێم دەنگی شەماڵێ
پەرەی هەوری گوڕی بارانە ئەمشەو

بزەی لێوی کچی خۆری خەیاڵم
گزینگی تێپەڕی کێوانە ئەمشەو

دژی سەرما دەڕووخێنن بە سەریا
تەز و تۆفی قەڵا وێرانە ئەمشەو

بەشارەت بۆ بەهارێ وا دەهێنن
کە لەودا سانەوە هاسانە ئەمشەو

نەسیم لێوی لە سەر بلوێری دانا
بەهاری باوەڕ و ئیمانە ئەمشەو

چەکی چاوی هەڵۆ سێرەی تەرازی
بەرەو زێد و لەف و هێلانە ئەمشەو

وەکوو ئەختەر لە بەر کاوانە بەیبوون
دەمی خونچەی گەشی پەیمانە ئەمشەو

زەوی پرچی بە خشڵی گوڵ دەنەخشێ
چەمەن کیژی گەڕی دیلانە ئەمشەو

تەکان و هەڵمەت و تاسەی تەماشام
گراوەی سۆسەن و سەیرانە ئەمشەو

لەرەی گوارەی ئەوینم وا لە کوێی گوڵ
تەکانی هەروەکوو جارانە ئەمشەو

سەرۆکی کۆڕی مووسیقایە بولبول
پەڕاوێزی گوڵاڵەی جوانە ئەمشەو

پەری هەڵبەست و نۆبووکی بەهاری
گەزیزەی ئارەزوو خەرمانە ئەمشەو

«پەشێو»ی ماچی ئەو لێوەم گەزیزە
دەسا خونچە دەمت بێرانە ئەمشەو

١٣٧٢/١٠/١
بۆکان

# گوڵاڵە

پەریزادێ هەواری دوورە ئەمڕۆ
خەیاڵی خەمڕەوێنی نوورە ئەمڕۆ

ئەگەرچی ئەو دڵەم چیمەن بەهارە
کەچی خێڵی گوڵی خاپوورە ئەمڕۆ

تەزین و ئاسەواری نامەوێ نا . . .
سەهۆڵ و بادەوەی مەئموورە ئەمڕۆ

نەسیم بەژنی شەقایق رادەژێنێ
غەزەل خاڵ و خەتی مەنزوورە ئەمڕۆ

بە ئاهەنگی نەکیسا شێعری شیرین
مەقام و زەمزەمەی ماهوورە ئەمڕۆ

«ئەوینی شۆخی شیرین بۆ کە فەرهاد
بە نەخشی بێ ستوون مەشهوورە ئەمڕۆ»

لە بەینی دوو بەهێی باغی بەرۆکی
دڵی پیر و تەڕم بەرموورە ئەمڕۆ

دەسـا چـاوی ئومێـدم بـەو مژۆڵـە
لـە ئێخـەی نەرگسـێ بیـدوورە ئەمـڕۆ

هـەوێنی شـێعری پـاراوی ئـەوینم
مـەزەی مـاچی گوڵاڵـەی سـوورە ئەمـڕۆ

ئەگـەر بولبـول بـزۆز و هـەرزەکارە
بـە خێـری چـاوی گـوڵ بیبـوورە ئەمـڕۆ

بـەهار و کیـژ و خێڵـم خـۆش دەوێ خـۆش
«پەشـێو« بـۆ باسـی وا مـەجبوورە ئەمـڕۆ

# هەواری رەش

لــە مەڵــبەندی دڵــی کــەیلم رەشــی هەڵــدا دەواری تــر
«گەشەی» شێعری «ئەوین» تۆرا رەشی پۆشا هەواری تـر

گـەلێ هۆنـەر قـەتاری چـوو بـەرەو کـۆچی رەشـی هـێمن
بە گـوێی سامانی خەمـدا دێ زرەی زەنگـی قـەتاری تـر

شـەتاوی بـێ بـرەس پەنگـە و بـزە و قاقـا دەخنکێنـێ
لەبەر دەرکی شەپۆرشـین ئەمـەش خورگـەی بـواری تـر

کــزەی پــایز پــرووزانی پــەڕ و باڵــی هەڵــۆی هــەردم
لـە کوێسـتانی سـەقز نایـێ زەڵـەی دەنگـی تـەواری تـر

وشـەی ژیـلا نقیمـێ بـوو لـە سـەر پـەلکی گوڵـی شـێعری
ئـەدی رەنگـە نـەڕەنگێنێ پـەرەنگی سـەوزی داری تــر

بەچاوی شێعریتـەڕدادێ خـورەیخـوێنیگەشـی کۆسـێ
لــە جــەرگی هەڵــکزاوی مــن لــە زامــی کۆڵــەواری تــر

بـە هـۆی هەڵبەسـتی پـاراوی لـە ئاسمـانی ئـەدەب دیـتم
بە سـەر شـەودا وریشـەی دێ هەسـارەی ئاسـەواری تـر

«پەشـێو» هەڵواسـە هەڵبەسـتێ لـە ئەسـرینی گوڵـی لالـە
لـە ئەسـتۆی بـووکی هـەرمانو لـە مـل کیـژی مـەزاری تـر

١٣٧٧/١/٢٠ ـ بۆکان

# هات و چوو

ڕوو بـە کوێستانی ئـەوین و جـێ هـەواری هـات و چـوو
دەنگــی هــەنگاوی ســەلانەی ڕێگــوزاری هــات و چــوو

ســـۆزی شمشاڵـــی بـــەهاری چیمـــەنی هێنـــا ســـەما
پێکــەنینی زاری خونچــە کــۆچ و بــاری هــات و چــوو

دوێ شـــەوێ ســـاقی شـــەڕابی دەرفـــەتی چـــاوی ڕژا
جامی چاوی قـاتی مـەی بـوو بـۆ خومـاری هـات و چـوو

تــەڕ نــەبوو مووچــەی هومێـد و زوو بـە سـەریا تێپـەڕی
هــەوری بــارانی وەفــا بــوو لی نــەباری هــات و چــوو

هەڵـــوەری ئەســـرینی زەردی چـــاوی شـــینی لێـــڕەوار
وا لـــەرەی لەرزانـــەکانی ســـەوزی داری هـــات و چـــوو

ئاسمـــانیش بـــێ هـــەتاوە شـــەو کـــڕە ئەســـتێرە ســـیس
ســەر زەوی تاریــک و لێڵــە خــۆری یــاری هــات و چــوو

بولبــولیش هێــزی چریکــە و زەمزەمــە و بەســتەی ســڕە
باوەشــی گــەرمی گوڵاڵــەی نەوبــەهاری هــات و چــوو

بــۆ دەقــی هــۆدەی «پەشــێو»ێ تاســە هێنــاتی مــەچۆ
بـا نەڵـێن بەڵـگەی جـەفا بـوو تاسـەباری هـات و چـوو

١٣٧٣/٩/٢٠ ـ بۆکان

# بۆ تۆ

قـــــەوارەی مەســـــــنەوی نابـــــارە بـــــۆ تـــــۆ
قەســـــیدەی شــــۆڕ و شـــــڕ ئــــازارە بــــۆ تــــۆ

لەشـــــــی نــــــەرمت ئـــــــەلاوێنێ ئەگـــــــەرچی
جــــل و بـــــەرگی غـــــەزەل ســـــاکارە بــــۆ تــــۆ

گوڵاڵـــــەی بـــــیری تــــۆ رســـــکا لــــــە هەســــتم
گەشــــــەی هەڵبەســــتی شـــــەو گوڵـــــزارە بــــۆ تــــۆ

وەنەوشــــەی ئەشــــقی تـــۆ شــــین بـــوو لــــە ئێخــــەی
کڵــــــــاوی ســـــــامەڕەند وا لارە بـــــــۆ تــــــۆ

لــــە مێــــژە هۆنـــــەری هۆنــــەی کنــــا لــــــەیل
چــــڕەی هــــۆرەی لـــــە شــــاهۆ ســــوارە بــــۆ تــــۆ

شــــــەپۆلی قەڵــــــپەزەی قەنــــــدیل قـــــەتاری
بــــەرەو بـــــەحری ئــــەوین رووبــــارە بــــۆ تــــۆ

وەرە بشـــــکێنە پـــــەرژینی تــــــەمی شـــــەو
شـــــەرارەی ئــــارەزوو لاســـــارە بـــــۆ تــــۆ

دەســـــا چـــاوی تــــەڕم جـــێ بێڵــــە ســـاتێ
دڵـــی تــــەنگم گــــەلێ جـــێ دارە بـــۆ تــــۆ

بـــە دوو دیـــدەی تەماشـــا تێـــر نـــەبووم لێـــت
کـــەوا چـــاوی ســـەرنجم چـــوارە بـــۆ تــــۆ

لـــە ئاســـۆی هەســـتی مـــن ئـــەنگووتی بۆیـــە
گـــەرووی شـــێعری «پەشـــێو» هـــاوارە بـــۆ تــــۆ

# هانی هەڵبەست

خۆشەویستم تۆ گوڵی سوور و گوڵی نازی منی
وا لە تۆی پەردەی دڵمدا تێکەڵی رازی منی

هانی هەڵبەست و مەقامن پێکەنینێکی ئەتۆ
کۆکی مایەی ئەسفەهان و زایەڵەی سازی منی

ئەو دەمەی هەستم دەتۆرێنێ خەمێکی نالەبار
شێعری پاراوی ئەوین و نۆتی ئاوازی منی

رایەڵی تەونی پەژارەم بیتەنێ دەرکی پەسیو
تۆ بەرۆکت ئاوەڵایە و باوەشی وازی منی

شەو گوڵی نەشمیلی بەژنت دێتە ئامێزی خەیاڵ
بۆنی شەوبۆی سەر سەرینە و بووکی دڵخوازی منی

خێزەرەی لاپاڵی ئاسۆ لێم بخنکێنێ پشوو
سێبەری داری هومێدی ژینی هەورازی منی

من بە سوورٍ و قەڵپەزەی رووباری سەخڵەت ناکەوم
تا ئەتۆ هێزی دەمار و هەڵمەت و هازی منی

گەر گوڵێ زەردی «پەشێو»ی پەرپەری کردی خەزان
«خۆشەویستم تۆ گوڵی سوور و گوڵی نازی منی»

١٣٧٣/٧/٢١ ـ بۆکان

# پایزی گریانە دەڕۆم

گوڵەکەم کەیلە دڵم ژینم گەلێ ژانە دەڕۆم<br>
بەرجەوەندم کەسەرە و گێژەوی ئاژانە دەڕۆم

هەڵفڕی خاسە کەوی شایەری دەنگ خۆشی چیا<br>
تا مەلی شێعری ئەوین دێتەوە هێلانە دەڕۆم

ڕێزی پیرۆزە لە گوێی داری هومێدم خەزەڵە<br>
کەوشەنی دار و دەوەن شەوگەڕی زریانە دەڕۆم

سەردەمێ گوڵ بە بزەی بولبولی دێنایە ژوان<br>
ئێستە لوورەی ڕەشەبا باوەشی جێژوانە دەڕۆم

ئەو گوڵەی چاوم گرێ دابوو لە چاوی کەژەڵی<br>
شەختە ژاکانی پەڕی پایزی گریانە دەڕۆم

بۆ جەسەی باڵ و پەڕی شێعری ئەوین و کەسەرم<br>
تا مەقەس گازە دەمی کەیفی لە قرتانە دەڕۆم

بۆ نەڕۆم من کە لە سەر باوەڕی هەڵبەستی تەڕم<br>
هەستی هەڵبەستی ئەوین دەفتەری تاوانە دەڕۆم

نامەوێ ژینێ کە وا بێ گوڵی ئاواتە «پەشێو»<br>
تا گوڵم دێتەوە نێو ئەم دڵە وێرانە دەڕۆم

پایزی ١٣٧٦

# هاوار

بەژنی پاراوی شلێرە و شاگوڵی کوێستانی تۆ
یا شەمامەی کاڵ و کرچی نۆبەرەی بێستانی تۆ

زۆر گەشن کاروانکوژە و ئەستێرەکەی سووچی بەیان
بۆ گریشە و دڵ بزێوی ناگەنە چاوانی تۆ

باسی کەزیە و کولم و لێوت دەفتەرێ شێعری دەوێ
کوا لە شێعرێدا دەگونجێ باسی بەژنی جوانی تۆ

چاوی لێ کە دەفتەرێ وا باسی ژینی تۆ دەکا
کیژی ئازادی هەواری چادرە زیندانی تۆ

نایەڵن دڵخوازی ژینت هەڵبژێری داخەکەم
پارە وەردەگرن لە تۆڵەت، یانی ها حەیوانی تۆ

خۆشەویستم بەشخوراوی راپەڕە بۆ مافی خۆت
شارەگی ملهوڕ دەرێنە شەرتە بێتاوانی تۆ

نووکی پێنووس هەڵخولێنە پێی بنووسە ژانی دڵ
هەر قەڵەم هێزی هەژارە تابەکەی نازانی تۆ

قەڵــپەزەی رووبــاری خــورێ بــە، بیتلێنــە بــێ پشــوو
کۆســپی چــەوت و نالــەباری جــا دەڵــێم ســیروانی تــۆ

کــوردم و خۆشــم دەوێ کوێســتان و ســارای کوردســان
جــا لــە بــەر ئــەو نــاوە خۆشــە مــاچ ئەکــەم چاوانی تــۆ

رایگــرە بــۆ بــیرەواری شــێعری هــاواری «پەشــێو»
تــا بــزانی خۆشەویســتی شــاعیری میــوانی تــۆ

١٣٧٨/١٠/٥ ـ بۆکان

# نالەیاری

لە ناخمدا خەمی میر و سەرۆکە
قەوەی مۆتەم لە سەر سینگ و بەرۆکە

دەسی قینی گەرووی قاقا دەگووشێ
کە بووکی پێکەنینم وا نەزۆکە

وەکوو کیژێکی دڵتەڕ دێتە ئامێز
کەچی پیرێژنی لەرزۆکی چۆکە

بە تۆڵەی ئارەزووی ئامێزی ئاوات
سەرم کاسی لەقە و مشت و چەپۆکە

لە بەر کۆسپی سەهۆڵ ڕەوتی زمانم
لە زاری بەستەڵەک ئەسپێ گلۆکە

نەچیری خۆشەویستیم لێ بزڕ بوو
کە وا سێرە و چڵەی چاوم چنۆکە

بە ئاوێنەی شەتاوی روونی چاوم
تەماشای نەرگسی دوو چاوی خۆکە

«پەشێو»م ناحەزی هاژەی شەپۆلە
وشەی جوانی چپەی نەرمی تنۆکە

١٣٧٤/٢/٢ ـ بۆکان

# بەهار

وا نەسیمی بای بەهاری لابەری ئازارە دێ
شیوەن و رۆڕۆ لە زاری بەفری کۆنی پارە دێ

تێکەڵی دەنگی شەماڵێ دێتە گوێی خاوەن دڵان
سازی پاساری بە نەزمی زایەڵەی پاسارە دێ

گمگمەی تاسەی ئەوینە و رەنگە دۆڕابێ دڵی
دەنگی گۆرانی ئەوینی کۆتری دڵدارە دێ

سۆزی فیتەی جۆربەجۆری سەد مەقامی سێرووە
کۆڕی مۆسیقای سروشتە یا لە تێلی تارە دێ؟

ئەو پەڕەسێلکەی کە هێلانەی گەرووی پڕ بوو لە خەم
شایەری میچ و دەلاقە و سەرپلووسک و دارە دێ

خەڵوەتی شاعیر دەگۆڕێ چاوی هەڵدێنێ بەیان
دیمەنی جوانی لە بەژنی سەنعەتی شاکارە دێ

تیشکی تاوی دەم بەیانی ماچ ئەکا لێوی گوڵان
وا هەناسەی خەوشی عەتری باوەشی گوڵزارە دێ

بەرهەمی جوانی سروشتە روومەتی لالەی بەهار
لێوی خونچەی سووری لالەی شاگوڵی نازارە دێ

نەرگس و نەسرین و مینا، چەن گوڵی جوانی تریش
نەخشی نەخشینی بەهارن هەر گوڵێ لەو بارە دێ

هاژەهاژی سەربەخۆیی کەوتە بەستێنی ئەوین
کۆسپی رێگا رادەماڵێ قەڵپەزەی رووبارە دێ

بووکی کەسکی دەشت و کێوە ئەو گەزیزەی خۆشەویس
لەو گوڵەی ئیلهامی شێعرم بۆنی بسکی یارە دێ

دەشتی مەڵبەندی وڵاتم پاکی نەخشینە، بەڵام
تەونی ئاڵۆزی «پەشێو»ە نەخشی وا ساکارە دێ

بۆکان ـ ١٣٧٢/١٢/١٧

# بلوێری بەهار

تێپـــەڕی تـــۆری منالّـــی هەســـتە زیـــز و خەســـتەکەم
پێکـــەنی خونچـــەی هومێـــدی بەرجەوەنـــدی هەســـتەکەم

کەوتـــە ســـەر پـــەردەی خەیالّـــم دەنگـــی بلـــوێری بـــەهار
مەلّـــهەمی چـــاری بـــرین و زامـــی زســـتان گەســـتەکەم

کـــوا شەمالّـــیّ بالّـــی هەلّـــکا خاشەکێشـــیّ دێـــو ســـپی
تـــا ســـەری جـــەوری دەجوولـــیّ بـــۆ بـــڕینی قەســـتەکەم

لابـــەریّ بـــەفری تـــەزیوی داســـەپاوی ســـەر چەمـــەن
بـــا گولّالّـــەی تـــیّمرووکـــیّ چیمەنـــە سەربەســـتەکەم

ســـەربەخۆ رســـکا لـــە هـــەرد و هاتـــە لەنجـــە یاســـەمین
بـــەیتی رزگـــاری دەخوێنـــیّ بولبولـــە سەرمەســـتەکەم

بـــۆ گولّـــی کەســـکی بـــەهاری شـــەرتی ژیـــنم وا دەلّـــیّ
بێتـــە ئـــامێزم گـــەزیزە لی شـــەتەک بـــیّ دەســـتەکەم

ئـــەو دەمـــەی بـــووکی گـــەزیزە هاتـــە کۆشـــی ئـــارەزوو
مـــارەیی بـــووکی «پەشـــێو»ە دەفتـــەری هەلّبەســـتەکەم

بۆکان ـ ١٣٧٢/٧/٢٨

# ئینتیزار

تین و تاسەی گوڵ بەهار و نەوبەهارت کوشتمی
ئارەزووی بینی گوڵاڵەی جاروبارت کوشتمی

هەر وەکوو خەونێ گوزاری سۆسەنێکم دێتە بیر
بیری خەونی هات و چوونی رێگوزارت کوشتمی

بۆیە ئەمشەو گۆمی چاوم خوێنی سووری لالەیە
تا سەرنجی دەفتەرم دا مۆری زارت کوشتمی

تا دەبینم ئەو شەرابەی چاوی نەرگس مەست ئەکا
چاوەڕێتم ئارەزووی چاوی خومارت کوشتمی

گوڵ بە شەونم خۆ دەشۆرێ وا گەڵا هەولەی ئەوە
ئەو گەڵا نامەحرەمەی باغی عوزارت کوشتمی

کۆچی خوار و ژوور ئەکەیت و جێ هەواریش ماتڵن
چاوەکانم جێ هەوارە و ژوور و خوارت کوشتمی

وا بەڵێنی دا گەزیزە دێتە دەر ئەم حەوتووە
بێ قەراری هاتن و دووری قەرارت کوشتمی

خـــەونی خـــۆش و تاڵـــی ژیـــنم ئیختیـــاری وا بـــە تـــۆ
لایەلایـــەی تـــاڵ و شـــیرین ئیختیـــارت کوشـــتمی

چـــاوەڕێی هـــەوری بـــەهار و کـــاتی بـــاران و گوڵـــم
وا پــــەژارەی دەردی دووری لالـــەزارت کوشـــتمی

تاســـە تاســـانی «پەشـــێو»ی هـــۆگری مەڵـــبەندی گـــوڵ
پەلکەزێـــڕین! زوو کـــە بێـــرۆ، ئینتیـــزارت کوشـــتمی

بۆکان ـ ٤ / ١ /١٣٧٢

# وەرە

وا بـــــەهار و چەمـــــەن و ڕێـــــژەنی بارانــــــە وەرە
تـــا گەڵـــا گـــوارە لـــە گـــوێی سۆســـەن و دارانـــە وەرە

وا دەڕۆی بـــۆ ســـەفەرێ چـــاوی لـــە شـــاری ســـەفەرا
تـــا جەفاکێشـــی ســـەفەر چـــاوی لـــە شـــارانە وەرە

وا پەپوولـــەی گـــڕی شـــەم بـــۆ شـــەمی ونبـــوو دەگـــەڕێ
تـــا وەفـــا تیشـــکی گـــڕی وەک شـــەمی جارانـــە وەرە

وا ســـەبوون گەرمـــە لـــەوێ بـــا نـــەکزێ پـــەلکی گوڵـــێ
تـــا هـــەوا فێنکـــە لـــەم شـــوێنە هەوارانـــە وەرە

وا قـــەتارەی گـــەلی مـــەل شـــایەری ئـــەم شـــاخ و کـــەژەن
تـــا زەڵـــەی دەنگـــی کـــەوێ زەنگـــی قەتارانـــە وەرە

وا پـــەری شـــێعر و غـــەزەل بـــاغی هـــەنار و سکڵـــە
تـــا غـــەزەل سکڵـــی گوڵـــی ســـووری هەنارانـــە وەرە

وا چیـــا خەوشـــە لـــە بـــۆنی هەڵـــز و کـــۆڕی مـــەنێ
تـــا گوڵـــی ئاڵـــی چنـــوور بـــووکی نســـارانە وەرە

وا نەسیم شەوگەڕە بۆ ماچی گوڵی تاکوو بەیان
تا سەبا بۆنی گوڵی مێخەکی یارانە وەرە

وا سروشتی کانی دڵە و نەرگسی مەستی چەمەنە
تا گوڵی مەستی ئەتۆ چاوی خومارانە وەرە

وا ئەجەل بێخەبەرە و دەرفەتی نەبڕیوە لە دەم
تا وشەی بەرزی ئەوین دەرفەتی زارانە وەرە

وا بەهار بەژنی گوڵی کەسک و گەشی دێتە ژوان
تا «پەشێو» شێتی گوڵی کەسکی بەهارانە وەرە

بۆکان ـ ١٣٧٢/٣/٤

# پایز

خەزەڵوەر بوو لە ساڵی دال و سینم
بەرەو زستان دەڕۆیی عەمر و ژینم

هەبوو مەیلم لە ژینمدا دەمێکی
جەماڵی ئەو لە خەودا شەو بدینم

کە پشکووتن گوڵاڵەی باغی بەختم
لە گوڵزاری دڵی گۆشەنشینم

بە ڕۆژی ڕوون لە ڕێبازی گوزاری
غورووری لێ شکا یاری مەتینم

بە شیرینی زمانی وەک زمانی
وتی خۆشم دەوێی بۆ هاوسەرینم

هومێدی دا بە داری ناهومێدی
بە ڕووباری ئەوین ئێستاکە شینم

دەمێ بەرز و دەمێ نزمی تەکانی
شەپۆلی ئارەزووی بەحری بەرینم

دەماوەندم وەکوو خۆ دێتە بەرچاو
لەوی ڕۆژێ کە سەربەرزی ئەوینم

گڕی سینەم لە سەر کەللەم دەکا تەم
شەرارە و ئاگر و پڕشنگ و تینم

لە ئەسرارم دڕا پەردەی نهێنی
بە هۆی چاوی خوماری نازەنینم

بە چاوی نەرگس و مەرگت قەسەم بێ
بەڵا مەرگت بە خەونیشم نەبینم

ئەمن هەر ئەو «پەشێو»ەی پایزی تۆم
هەتا مابێ هەناسەی ئاخرینم

شاهین شەهری ئیسفەهان ـ ١٣٦٤/٨/١٤

# داوەتی گوڵ

بەهارە و دەنگی بلوێری دەژاکێنێ پەرێشانی
بە قامی بەفری تاران و بە سۆزی تۆزی بۆرانی

لە چیمەن تۆزی خەمباری دەشۆرێ هەوری ئەم وەرزە
بە ئاوی نەرمی ئەسرینێ لە چاوی تاسەبارانی

کە تۆزی وردی بارانە گزینگی تاوی تێ پڕژا
کەوانەی پەلکە زێڕینە دزێوی دێتە ئامانی

کەنێرە و چاوی گوڵباغی گلاری شەونمی تێزا
بزەی تیشکی هەتاوی دی گەڵێ شیرینە گریانی

چنوور و مێخەک و بەیبوون، هەڵاڵە و بەژنی مێلاقە
گەشەی پاراوی خەشخاشە. شلێرەش هاتە لاشانی

بەڕۆنە و نەرگس و شەوبۆ. شەپۆلی بۆنی ئەم هەردەن
گوڵی ماستاوی مێرگوڵە بە شوێنی سێوەڕەی زانی

نەشەی شێرە و شەپاڵ تەختە. پەرێز و کێوی داپۆشی
کەپۆی مەزرا کە بۆنخۆشە گوڵی بێژانە بێژانی

وەنەوشە و سوێسنە و هێرۆ لە گەڵ یاس و گوڵی مینا
گوڵاڵە و مریەم و نەسرین هەموو تۆراوە تۆرانی

گوڵی کوێستانی مەڵبەندم گەڕی دیلانی وا گەرمە
گەزیزەی بووکی سەرچۆپی بە رەنگی کەسکی نەخشانی

بەهارە و جەژنی قوربانە و قەتارەی سوورەگوڵ رەنگا
لە دەشت و دۆزەق و بەرزی بە رەنگی خوێنی قوربانی

«پەشێو»ی دوورە ئاوات و نزیکی قەرقەشەم ئەمما
هومێدی ماچی ئاواتم لە دەس نادەم بە ئاسانی

فوولاد شەهری ئیسفەهان ـ ١٣٧٣/٢/٣١

# ناحەزی

ناحەزی! لاچۆ لە زێدم نوێنەری ژانی بڕۆ
تەوقی ئەستۆی چۆکی ژێری دەستی دامانی بڕۆ

هەڵمەتی نانووخی تیژی سەر گوڵی کوڵمی ژنی
جۆگەلەی خوێنی رژاوی روومەتی جوانی بڕۆ

جەرگی هەڵقرچاوی باب و رۆڵە رۆی دایکی کوڕی
کۆسی کەوتەی ماڵە خزم و داخی جیرانی بڕۆ

شیوەنی دیدەی کەژاڵی خوشکی بۆ تەرمی برا
قەڵپەزەی رووباری سووری گۆمی چاوانی بڕۆ

تۆ خەمی دابینی کۆنی پشتی چاوی بێ بزەی
یا چڵەی چاوی نەخەوتووی شەو پەرێشانی بڕۆ

باوەڕی لاوی نەفامی تووڕی هەڵدەی پیرە باب
قۆڵی باڵنجی شەوانەی بابی کۆڵانی بڕۆ

شیتەشیتی زاری بووکی تا خەسوو دەرکەی لە ماڵ
باوەشی چۆڵی ژنێکی دوورە هێلانی بڕۆ

بــۆی کــەبابی دەوڵــەمەندی پــڕ دەکــەی ســفرەی هــەژار
بــۆ چــەکی جــەرگی هـــەژاری بـــێ ژەمـــێ نـــانی بـــڕۆ

درهـــەم و دینـــاری ســـوودی دێتـــە بـــازاڕی ســـەلەم
فێڵـــی خێڵـــی پـــارە پیســـی چـــەوتی ئیمـــانی بـــڕۆ

دەســـتی بـــەربینی گوڵاڵـــەی پێکـــەنینێکی گەشـــی
هێـــزی خنکـــانی کـــەنین و حێقـــی گریـــانی بـــڕۆ

گێژەڵـــووکەی بەربڵـــاوی دێتـــە نێـــوماڵـــی ئـــەوین
بـــەردی بنچینـــەی پەراشـــی ماڵـــی وێـــرانی بـــڕۆ

بـــۆ بـــزەی لێـــوت «پەشـــێو»م هەیکـــەلی جـــوانی وەرە
«ناحـــەزی! لاچـــۆ لـــە زێـــدم نوێنـــەری ژانی بـــڕۆ»

بۆکان ـ ١٣٧٣/٢٠

# گەزیزە

هەنیســـــکی تـــــەم زەڵـــــەی ڕۆڕۆیـــــە ئەمـــــڕۆ
دزێـــــوی خـــــەم لـــــە بـــــن گڵـــــکۆیە ئەمـــــڕۆ

ڕنـــــوو بـــــەفری کـــــەژی کوێســـــتانی هەســـــتم
شەماڵـــــــی دایـــــــدڕی تۆتۆیـــــــە ئەمـــــــڕۆ

تـــــەزی تووشـــــی بـــــەهاری دی فـــــەڕی مـــــرد
لەشـــــی خۆشـــــی گەشـــــی ئاســـــۆیە ئەمـــــڕۆ

بـــــە شمشاڵـــــی نەســـــیم داواتی گەرمـــــە
لـــــە ســـــەرچۆپی گـــــەزیزە دۆیـــــە ئەمـــــڕۆ

فەلـــــەک تـــــەونی بـــــە شـــــانەی بارشـــــی کـــــرد
کـــــە چیمـــــەن ڕایەڵـــــە و گـــــوڵ پۆیـــــە ئەمـــــڕۆ

شـــــەپۆلی بـــــۆنی عـــــەتری گـــــوڵ پـــــەرەی ســـــەند
کـــــە میـــــوانی ســـــەبا شـــــەوبۆیە ئەمـــــڕۆ

لـــــە ســـــەر باڵـــــنجی خـــــەرمانی وەنەوشـــــە
گوڵـــــی نـــــەرگس قـــــژی لۆلۆیـــــە ئەمـــــڕۆ

ئـــەوەی خاڵـــی گوڵـــێ شـــەونم تـــەڕی کـــا
تـــەڕی تاســـەی دەمـــی خاڵـــۆیە ئەمـــڕۆ

بـــە زاری گـــوڵ کـــە بولبـــول مـــەی بچێـــژێ
غـــەزەل مەســـتە و لـــە خـــۆ بـــێخۆیـــە ئەمـــڕۆ

گـــەلێ جـــوانی بڵـــاون لـــەم هەرێمـــە
بەڵـــا گشـــتی لـــە تـــۆدا کۆیـــە ئـــەمـــڕۆ

دەســـا مـــۆری لـــە ســـەر نـــێ پەلکەزێـــڕین!
شـــنەی شـــێعری «پەشـــێو» بـــۆ تۆیـــە ئەمـــڕۆ

بۆکان ـ ١٣٧٢/٢/٢٧

## دڵ شکاو

ئەگەر سێرەی لە سەر میزانە چاوێ
بەرەو ناخی دڵم تیری بهاوێ

وەها تیرێ کە زووخاوی دەروونم
لە ئەستێری کەلاوی کا پەلاوێ

بەڵێنی بوو پەری شێعر و غەزەل بی
غەزالێ سڵ نەبی بۆ چاوەڕاوێ

دڵت بردم لە گەڵ قەولت شکانت
بە چی پینەی دەکەی هەر دوو شکاوێ

لە هاوینی دڵم زستانی، دڵڕەق!
تەزی مەرگی لەحانی دڵ کزاوێ

گڕ و تینی ئەوین بۆ ناکوژێتۆ
لە ئەسرینی بە سەردا دێ شەتاوێ

پەپۆکەی سەرگوڵی رووکە قژی کاڵ
نەکا ئاهی ئەمن تۆژی بساوێ

سەر و بسکت مەلاوێنە بە شانە
دەبێ تاڵی بە دەستی من بلاوێ

لە ئەسرینم کەوێ تیشکی هومێدت
دەبیتە پەلکە زێڕینە بە تاوێ

دەم و لێوم بە لێوانت بدوورە
دەنا لێوم دەدا نێوت لە قاوێ

وەرە ئاشق نموونەی قەولی راسن
لە مێژوودا بخوێنە بەیت و باوێ

ئەتۆ لەیل و گوڵ ئەندام و مەنیژەی
ئەدی ناوی «پەشێو»ی تۆ چ ناوێ

بۆکان ـ ١٣٧١/١١/٢٠

# نەچیری ئارەزوو

لەشی مەینەت بەشی لەم ناوە ناچێ
پەژارەی باوەشم بەو لاوە ناچێ

خەمی دووری ئەوین ئازاری باوە
خەمی لۆدەم لە بەر ئەو باوە ناچێ

دەسی ئاژاوە شێوانی دەروونم
ئەوینێکە وەکوو ئاژاوە ناچێ

هەتاوی عومری من وا هاتە گوێبان
هەتاوی رۆژ پەڕم لەو ساوە ناچێ

گەلاوێژم لە بەر دیدەی بەدی کرد
کەچی سیسە و گەشەی لەو چاوە ناچێ

تەڵە و داوی سەرنجم دا لە دەوری
مەلی چاوی قەرەی ئەو داوە ناچێ

دەڵێن هەودای خەیاڵە بسکی خاوی
خەیاڵی ناسکیش لەو خاوە ناچێ

پەری شێعرم گوڵی کوێستانی کوردە
کە ناوی هەر گوڵێ لەو ناوە ناچێ

نەچیری ئارەزوو هەر چەندە پەیتە
نەسیمێ دێ دەڵێ ئەو راوە ناچێ

«پەشێو»ی تیشک و تاوی سەردەمێکم
لە گوێبانی بەیان ئەو تاوە ناچێ

بۆکان ـ ۱۳۵۳/٦/۲۰

# پەلکەزێڕین

گزینگـی رۆژی روخسـاریٚ تروسـکەی هاتـە سـەر ژیـنم
پــەژارەی هەڵــپڕووزان و لــە پڕشــنگی گـڕ و تیــنم

کـوڕووزی بـەختی قاقـڕ بـوو نـەمامی ژیـنی بـیٚ ئـاوم
ئـەوا ئەمـڕۆ لـە باغیـدا لـە سـەر پۆپـەی ئـەوین شـینم

تـەزو و شـەختەی جـەفاکاری بـە سـیخواری سـڕم ناکـا
بــزەی لێــوی شــنەی کۆشــی وەفــا بێنێتــە پــەرژینم

گلێنــەم فەرشــە بــۆ لاق و ســەرم رێبــازی رێگایــە
کـە فـەرهادی کـەژی ئەشـق و لـە سـەر بـڕیاری شـیرینم

دڵـم تیرێکـە هاویشـتم بـەرەو سـینگ و دڵـی سـەختیٚ
بشـیٚ کـون کـا دڵـی بـەردی کەژاڵـی پەلکـە زێـڕینم؟!

پەرۆشی ئـەو سـەر و زولفـەم کـە سـاتیٚ باغـەوانی بـووم
ئەجـەل ئیـدی نـەدا مـاوەم دەمێکـی دیکـە بیبیـنم

دەسـا وا بـوو هـەتا مـاوم لـە دەورم پێکـەنینت بـیٚ
بە کەڵکم چی دەخوا مردم لـە سـەر گـۆڕم بکـەی شـینم؟!

وەرە دەرفەت وە دەس بێنەو شەویٚ ساقی «پەشێو»ت بـە
مەڵـیٚ کفـرە ئەگـەر بێـژم ئـەتۆی قیبلـەی دڵ و دیــنم

١٣٧١/١١/١١

# خۆشەویستی

دەڵێم شێعرێ بڵێم بۆ عەسری دوێنێ
کەوا شۆخێ وچانی بوو لە شوێنێ

نەمامێ بێ لە مووچەی خۆشەویستی
دەری باوێ بەر و باری نهێنێ

بەرز بێت و تەرز بێت و گڕ و تین
گەڕی چۆپی جەماڵی هەڵخولێنێ

گەلاوێژی دەمی ئاسۆی شکۆ بێ
بە سەر شەودا وریشەی داوەشێنێ

زەوارێ بێ لە چاوی بۆ زیارەت
لە مێحرابی برۆی سەر دانەوێنێ

گوڵاڵەی دەشتی موکری بێ بە سووری
گەش و تەڕ بێ وەکوو کوڵمی بە خوێنێ

لە دەیجووری قەڵەم قورسی قەمەر بێ
لە ڕۆژی روومەتی روونی بسێنێ

لە مەیخانەی دەمێ پەیمانە پڕ کا
کە خونچە لەو دەمەی رسوا دەمێنێ

شەپۆلێ بێ لە سینگی نەرمی دەریا
تەکانێ بێ مەمانی هەڵپەڕێنێ

شەتاوی فێنکی دەوری گڕێ بێ
تەماشا بێ گڕی دڵ دامرێنێ

کەلامێ بێ «پەشێو»ی پێ بشێوێ
سەلامێ بێ ئەوینێ هەڵگرێنێ

بەڵا رووگەی غەزەل هێن چووک و ماتە
قەدی بەرز و جەماڵی نانوێنێ

بۆکان - ١٣٧١/٥/٥

# زەڵەی دەنگ

گەرووی گەرمی وەڵامێکە هەڵۆی پیری هەژار ئەمڕۆ
زڕەی زەنگی هەوارێکە زەڵەی دەنگی تەوار ئەمڕۆ

دەڵێی پا بێنە سەر چاوم دەروون دەریایە بۆ هەستت
شەپۆلی دێ بە چاومدا شەتاوی بێ بوار ئەمڕۆ

هەڵەی بیرە کە فەرمووتە نەتۆ راوی نە من داوم
مەنیژە و لەیلی و شیرین لە مێژوون یادگار ئەمڕۆ

وە یا فێری فرینت کەم بڕۆین خەوتوو هەڵستێنین
هەڵستێنە منی نوستووی نەزان و بێ قەوار ئەمڕۆ

مراوی جووجەڵەی چۆمی لە کوێ پێویستە فێری بی؟
مەلێ زانین خدەی خۆتە لە بەحری بێ بنار ئەمڕۆ

گەڕی شەختەی سڕی سەختی چەنێ قڕ کا هەڵۆی هەردێ
هەڵۆ زۆرن لە زێدی دا بەوەی نابن قوتار ئەمڕۆ

بەهارێ دێ هەتاوێکی لە زۆزانێ دەڕاوێنێ
پەرە و سام و تەز وچۆقی رنوو بەفری نسار ئەمڕۆ

دەسا ئەو دەم تەماشا کە لە ئاسۆدا گەڕی گەرمە
لە دیلانی بەهارێدا چنوور و سەرچنار ئەمڕۆ

مەکە لۆمەی هەڵۆی بیرم نەچیرێ بوو لە هێلانەت
تەمی ئاسۆ وچانی دا هەڵۆی تۆڵەی وتار ئەمڕۆ

پەری شێعرم غەزالێکە سڵ و نامۆیە بۆ هەستم
بزانێ بۆ بزەی مەستم، دەدا هەستم لە دار ئەمڕۆ

دزی دەستم دەجوولێنۆ لە چاومدا کە بێجووتم
لە باغێدا بجوولێنۆ ئەگەر جووتێ هەنار ئەمڕۆ

دەڵێم کیژی بزانی خۆم دەبێ هۆشی «پەشێو»ت بێ
پەری شێعرێ رەچاوت کەی تەڕ و ژیر و لەبار ئەمڕۆ

بۆکان ـ ١٣٧١/٨/٢٨

# ئاسەوار

وردەی هەستم دەجوولێنێ بە ئیلهامی گوزار ئەمڕۆ
بە لاتیلی سەرنجێکی لە دوو چاوی خومار ئەمڕۆ

لە ئاوێنەی سەرنجیدا سەرنجم دا کە دەیمالی
بزەی نەرمی وەکوو هەوری لە شووشەی دڵ غوبار ئەمڕۆ

پزووسکی ئاوری لاوی لە بن بەورووی سڕی پیری
گڕی پێدا بزەی شۆخێ بە یادی جێ هەوار ئەمڕۆ

حەسوودی بووم تەقەی هەستا زەوی ماچی لە کەوشی کرد
هەتا هەنگاوی هەڵهێنا بە تەعداد و ژومار ئەمڕۆ

بەی و سێو و گوڵ و نێرگز لە باغی دیمەنی دیتم
خودا خێرە لە نەیسانا بە ساڵێ دوو بەهار ئەمڕۆ

پەپوولەی دڵ گوڕی گرت و فڕی بۆ سەر گوڵی تاسەی
بکا چێژی ڕەواڵی ژین لە دوو لێوی نیگار ئەمڕۆ

سەرنجی خاڵی دوو کوڵم و سەری چانەی قوماریێ بوو
سەر و بیر و دڵم دۆڕا بە سێ خاڵی قومار ئەمڕۆ

هەڵۆی پیرم، لە باڕیدا شەهێن و قوش نەچیرم بوو
بە ئاواتم نەچیرێ بم لە هێلانەی تەوار ئەمڕۆ

ئەگەر خونچەی دەمی گوڵ کا لە سەر قەولێ بە دیداری
دەبێ دانێم سەرم وەڵڵا لە سەر قەول و قەرار ئەمڕۆ

وشەی ناوت وریشەی دێ لە پەڕتووکی «پەشێو»ی تۆ
لە سەر دێڕی ئەوینیدا بە ناوی ئاسەوار ئەمڕۆ

١٣٧١/٢/١٨

# دەمی پیری

مـــــــــەلی گەنجی لە گوڵزارم فڕیوە
قەلی پیری لــــــــە سەر لاشەم قڕیوە

بە هۆی نان و جلی زارۆولــــــەکانم
سەگی شاری وڵاتم لـــــــــێ مڕیوە

پــــــەرێشانم شەوی ساڵی وەلادەت
شەمی حــــــەفتا لە سەر کەیکم گڕیوە

برۆی چەرموو بە مالووسکەی سمێڵۆ
رنوو بەفرن لــــــە کوێستانم کڕیوە

دڵم تەنگی لــــــەقی لاقە و تەمی چاو
پشوو سوارە و هەناسەی لێم بڕیوە

سری مۆخم بـــــــڕووسقانی وتارم
زمانم گەی گرە، ویـــــــتەی وڕیوە

کەڕی کردم خشە و هاژە و دڕینگەی
سەری پیری وەکوو زەنــــگی زڕیوە

دژی بابی کز و پیری گەلێ کـــــــوڕ
بە ئەسپی سەرکەشی ڕەشمەی چڕیوە
لە بەر بیری هەڵۆڵی بــــــاوەڕیدا
کراسی عاتیفە جلکێ شڕیـــــــوە

غەزاڵی دەستەمۆیە بۆ خەزوورەی
کوڕی خوێڕی لە من شێری گوڕیوە

دەمی پیری بە تەنیام و گەلێ شـــەو
دەسی لەرزیو نمی چاوی سڕیـــوە

کوڕی ژیر و بزانم لێ دەبـــووری
کەوا ئەوڕۆ «پەشێو» پەردەی دڕیوە

بەهاری ١٣٧٠

## رێبەری ناز

وەکوو من گێژ و بێ هۆشە کەسێ هۆشێ لە سەریا بێ
بدینێ رێبەری نازی بە رێبازی گوزەریا بێ

بە چەشنی ئەو گوڵە شۆخێ خەیاڵیش لی نەخوڵقاوە
بەنی ئادەم وەها نابێ دەبێ ئەو شۆخە پەریا بێ

لە گەڵ ئەبرۆی کەمەرکووڕین لە بۆ کورنۆشی سالارێ
مژۆڵی فەوجی سەربازە و لەناو سانی نەفەریا بێ

دەڵێن مانی کە مەشهوورە لە باوەڕ کرد نم دوورە
بەسانی دیمەنی چاوی لە نەخشاوی ئەسەریا بێ

گزینگی ئارەقی شەرمی تروسکەی بێ لە سەر کوڵمی
نیە و نابێ بە هۆی شەرمی لە گوڵ شەونم نەوەریابێ

دەڵێی نووکی ئەڕاڕاتن بە تۆزی مژ بڕازێنۆ
لە سەر سینگی مەمەی بەفری کراسی شەو لە بەریا بێ

وە یا کاتێ بلەرزێنۆ لە ژێر ناسک کراسیدا
لەرەی بەدری شەوی ساوە لە سەر ئەمواجی دەریا بێ

تەواوی پەڕپەڕی زێڕین بە ناوی دەفتەری ئەشقم
بشێ ناوی «پەشێو» جارێ بە سەر سەفحەی نەزەریا بێ؟!

بۆکان ـ ١٣٦٩/٨/٩

جاریٚ شێعرم بۆ بەهارە و تاویٚ شایەر داوەتم
تاکو دەگری دەستی شایی شایەری ئەو تاوەتم

وا سەرنجم رادەکێشیٚ ساوی لێدەی هەڵپەڕی
تەنگە پێڵاوت فڕێدە قۆنگەرەی ئەو ساوەتم

چاوەکانت جاروباریٚ هەڵدەهێنی بۆ نەچیر
شاهەڵۆی بەرزی شکاری کۆتری ئەو راوەتم

دەستی نەرمت بێنە بگرە دەستی گەرمی ئاگرم
وا بڵێسەی گەرمی ئەشق و ئاگری ئەو چاوەتم

لێوی شەکر و زاری خونچە ئاگری دا دین و دڵ
ناوی تۆ زکری زمانە و کافری ئەو ناوەتم

هەستی پەنجەم رادەکێشیٚ هاتە سەر لیمۆ قژت
وا حەسوودی هەڵمەتی ئەو بسکە ئاڵۆزاوەتم

لەو دەمەیڕا وا ئەوینت بوو بە ئاژاوەی دڵم
شێوەنی چاوی هەتیوی دڵ پڕی ئاژاوەتم

تا نەسووتێم وەک پەپوولە بۆ ئەوینی پاکی تۆ
هەر «پەشێو»ی ماچی لێوی ئەو شەمە سووتاوەتم

١٣٧٢/٤/١٩ ـ بۆکان

# وڵاتی بەرین

وڵاتێکی بەرینم دی هەموو جوانی لەوێ بوو
نە مەرگی پێکەنینێک و نە زۆری خەسرەوێ بوو

کەسێ ئیشی بەڕێزی بوو گەلێ ڕێزی دەگیرا
نە زاڵم هەڵمەتی مابوو نە ڕێزی ئەو دەوێ بوو

نە چەرخی دوو زمانی بوو دژی خۆشی بسووڕێ
نە زاری بۆگەنیوی خەم دەمی شیتەی هەوێ بوو

نە ئاسنگەر خەتاکار و لە ئەستۆی مسگەرێ دەن
نە تۆمەت بۆ گەلی عالم بە هۆی عامی هەوێ بوو

هەتا چاوێ گوزاری بوو گەشەی گوڵ بوو نەشەی دڵ
نە تەم پەردەی تەماشا بوو نە پەرژینی چەوێ بوو

نە خوێناوی دڵی مینا بە چاوی دادەچۆڕا
نە شەختەی شەوگەڕی زەردی پەلاماری شەوێ بوو

چرەی بولبول هەوێنێ بوو ئەوینی پێ دەگرسا
قەناری وێژەری باغ و لە کێو دەنگی کەوێ بوو

هەموو شوێنێ ئەوینێ بوو دڵی ژیری دەلاوان
نە ئازار و نە بێزارێ نە چۆقی شەو تەوێ بوو

بــە چــاوی دڵ ســەرنجم دا کــە دیم ســووچی بەهەشــتە
شــەرابی کەوســەر و ســاقی لــەوێ جــووتی زەوێ بــوو

وتم هەســـتم تەماشــا کـــەم هـــەلی گەشـــتی «پەشـــێو»ە
بەڵــا کاتـــێ تـــەکانم دا ئـــەوەی دیـــتم خـــەوێ بـــوو

شاری کوردی ئیسفەهان ـ ١٣٥٥/١٥/١٨

## نەورۆز

دەڵـێن ئەورۆکـە نـەورۆزە و لـە یاسـادا دەقـی مـاوە
لـە بـازاڕ و خـولی مێـژوو وەکـوو زوو رەونـەقی مـاوە

گـڕی ئـاگر لـە نـەورۆزا، لـە بـیرم دا دەبزوێنـێ
خـدەی زەردەشـتی ئێـرانی لـە چیمـەن زەنبـەقی مـاوە

بەڵـا داخـی گـرانم دێ لـە دیمـەن هـەر کـەس ئـەڕوانی
لـە ژێـر بـاری پەرێشـانی لـەش و لاری لـەقی مـاوە

بـە سـەر خـاکی وڵـاتمدا گـوڕەی دێـوی نـەزانی دێ
چلـۆن خۆشـی لـە دڵـدا بـێ هـەتا چـاوی زەقـی مـاوە

چەمەن رووتە پەرێشـانە گوڵـی زەنبـەق لـە دەسـتی چـوو
بـە زوڵـمی باغـەوانی خـول زەنی رۆیـی بـەقی مـاوە

بـە تاڵـانی دز و جـەردە لـە ماسـی بـێ بـەش و برسـی
هـەموو دەنگـی سکاڵـایە کـە لـەقلـەق تـەقتـەقی مـاوە

مـەقام و رێـزی ئینسـانی لـە دیوانـا هـەقی رۆیـی
بـە دەسـتی داوەری ناشـی لـە گـەڵ نـادا هـەقی مـاوە

ئــەوەی مابــێ لــە ســاواکی گــەلێ مــاوە شەهیدەڵڵــا
ترۆر و ئـەتکی نـامووس و پـەت و قـەمچی شـەقی مـاوە

ســەرنجی دەن ئەگــەر بێتــۆ لــە بەندیخانــەدا لاوێ
کــەبابی زاڵــمە نەرمــەی چــەنێ پێشــەی رەقــی مــاوە

ئــەوەی دەکــرێ لــە زینــدانا لــە گــەڵ کیــژی وڵــاتمدا
قەڵــەم شــەرمی لــە نووســینە و بــە شــەرمی ئـارەقی مـاوە

بە دەس بەدخوو گەلی حاکم هـەموو خەڵـکی کـز و مـاتن
هـەتیو برسـی وەکـوو زانـا رەگ و پـێس و چـەقی مـاوە

بــە نــاوی بــەرزی ئــازادی شەلاڵــی خوێنــە ئــازادی
لــە ســەر گــۆڕی شــەهیدانم نیشــان و بــەیرەقی مــاوە

شاری کوردی ئیسفەهان - ١٣٥٦/١/١٥

# پایز

پایزی تووشی لە ئاڵۆزی حەزی
تاقمی تاڵانی وەرزی دابەزی

نوێنەری قین و گەڕاڵی شەوگەڕن
شاڵی سەوزی لابەن و جلکی خەزی

هەڵمەتی زریانی تووشی کەوتە گەڕ
چیمەنی پێوا بە ئەنگوستی گەزی

خێڵی شەختەی لێڕەواری پشکنی
چۆقی تۆقی لێوی زەنوێری گەزی

با تەزو مەرگ و پەلاماری گەشە
داغی مەرگە و جەرگی لالەی پێ تەزی

باوەشی سەوزی زەوی زەردی خەمە
باخەڵەی تاکیش بە تاڵانی رەزی

تەوقی مژ تاکوو بخنکێنێ چیا
وا لە ئەستۆی کێو دەهاڵێنێ کەزی

وا کەسیرەی سەخڵەتی سەرماوەزن
سێبەری مەرگی مەلە سەرماوەزی

بولبولیش تاسەی بەهاری ماتڵە
تا شنەی شەن کاگوڵ و کەوکا جەزی

بۆ «پەشێو» سا بێنە مزگێنی بەهار
سامی کوێستانی هەڵۆی و نابەزی

بۆکان ـ ١٣٧٢/٩/٦

# پەیام بۆ یار

گڕوگڕپـــەی ئـــەوینی تـــۆ هـــەتا ئـــاواتی مـــانم بـــێ
شـــەرارەی دڵ بســـووتێنێ ئـــەبێ خۆشـــی زەمـــانم بـــێ

برۆ و برژانگ، کەوان و تـیر منـیش راوچـیم و پێویسـتە
لـــە راوی چـــاوی شـــاهێنت دەبـــێ تـــیر و کـــەوانم بـــێ

کـە لێـوی ئـاڵ و قـەیتانی وەکـوو گـوڵ تـازە پشـکووتن
وەکـوو بولبـول منـیش دایم ئـەبێ مـەیلی گوڵـانم بـێ

شـــکا بـــازاڕی مـــرواری لـــە کـــاتی پێکـــەنینی تـــۆ
بـــە دینـــارێکی ناســـێنم هـــەتا دوڕڕی دڕانم بـــێ

لـە شـەکر و شـەربەتی زارت، بـە فینجـانی دەمـت بێـژە
خەڵـاتم کـەن بـە فـەرمانێ، شـەراب و مـەی بـە ژانم بـێ

لـــە بـیرە مــاچی شـیرینت هــەتاکو سـەردەمی مــردن
مەگـەر «بـا»کـەی خـەزان بیبـا و گـەلاڕێزی خـەزانم بـێ

ئـەبێ هـەر وا بـە دڵ گـەرمی بـە لالـەی داغـی بـاغی بم
بـــە شـــەرتێکی هـــەتا مـــردن کەژاڵـــم باغـــەوانم بـــێ

دەبا دەنگی ئەوینی من هەتا تۆ سارەوانی بی
زرینگەی زەنگی شەیدایی لە ئەستۆی کاروانم بێ

لە چوار تێناپەڕێ حەرفێ کە شیرینن بە هۆی ناوت
ئەڵێم ناوت بدرکێنم بەڵا لاڵی زمانم بێ

«پەشێو» ئەیکا بە هۆی شێعری سەلامی گەرم و پێت ئێژێ
وەفادارم بە قەولی خۆم هەتا رۆح و رەوانم بێ

تیکانتەپە ـ ١٣٤٨/١٠/١٩

## بەهار

بـــــە تـــەپڵ و عـــوود و بـــە تـــار هاتـــەوە
بـــــــە قـــین و رق و بـــە قـــار هاتـــەوە

لـــە ســـەر قەنـــدیل و شـــاهۆی بـــەرزەوە
لـــە ســـەر بـــــەڵێن و و قـــەرار هاتـــەوە

پـــەیکی بـــــــەهاری دژی دێـــو ســـپی
ئەمساڵـــــیش دیســـــان وەک پـــار هاتـــەوە

شەماڵـــــە تـــــوورەی تونـــــدی بـــێ وچـــان
لـــە شـــەڕی بـــــــەفری هـــەوار هاتـــەوە

شـــــــەڵلاقی شـــــەماڵ بـــــــــــەفری دادڕی
لـــــــە شـــاخ و دۆڵ و نســـــار هاتـــەوە

بـــــــەفری کـــــردە ئـــاو چۆڕچـــۆڕە گریـــا
زنـــــــــە بـــۆ داوێـــن جۆبـــار هاتـــەوە

ئاوێنەی زنجیر ئاوی دۆڵ و شیو
بە تیشکی هەتاو بۆ خوار هاتەوە

خوورەی شەتاوان قەڵپەزەی چۆمی
لە جەوری زستان بێدار هاتەوە

لە چۆماوی دێ کووزەڵە و پنگەی
ڕەعنا و رابیعا و عوزار هاتەوە

کەژ و کێو شینە و پڕ لە ئاواتە
مەنێ و کنیوال بۆ شار هاتەوە

شوانە بە دەنگی بلوێری خۆشی
بە سۆزی خاڵۆی ڕێبوار هاتەوە

زەوی پرگی کەوت فەلا دڵ خۆشە
کاتی شیو بڕین جووتیار هاتەوە

سینگی عەرز ئەدڕێ و نان هێنی ماڵە
دەک! مانوو نەبێ لە کار هاتەوە

گوڵاڵە سوورە و گەزیزەی ڕەنگین
لە تووشی زستان بێزار هاتەوە

دەچن بۆ شاخی دەهێنن کەنگر
کیژی چاوبەڵەک پەروار هاتەوە

لە دەس کیژۆڵە چەن دڵ ڕفێنە
چەپکە گوڵ لە پای موغار هاتەوە

نەسیمی بەیان پەیکی بەهاری
میوانی گوڵ و گوڵزار هاتەوە

بە دیاری عەتر و سەوقاتی عەبیر
شنەی بەیانی عەتار هاتەوە

قاقای هەڵاڵە و بزەی وەنەوشە
نێرگزی خۆشبۆ و خومار هاتەوە

داری بەر پشکووت ڕەنگینە زەوی
شەکرە سێو لە گەڵ گوڵنار هاتەوە

ئاڵۆزە بۆلف زستان گوم کردوو
غەزاڵی خۆشڕەم بە غار هاتەوە

چەن خۆش ئەخوێنێ بە ئەشقی گوڵان
عەسر و بەیانی هوزار هاتەوە

قاسپە قاسپی دێ بە دەنگ ئاشنای
کەوی خۆش خاڵی کۆسار هاتەوە

شەقەی شاباڵ و بە ناڵەی گەروو
گا کۆتر بۆ سەر چنار هاتەوە

باڵندەی چۆمە و سواری مەوج ئەبێ
قوو بە سەد فیز و دەمار هاتەوە

بە سۆز ئەخوێنێ قومری سەرخۆشە<br>
لە گەڵ جووتی خۆی کەنار هاتەوە

لە سەرلکی دار بۆڵی ترێی رەش<br>
سێروو بە پۆل و قەتار هاتەوە

هەر یەک بە جۆرێ بە یەکتر دەڵێن<br>
نەورۆزت پیرۆز بەهار هاتەوە

بۆ سەیری بەهار هیوای دڵداران<br>
قانع و هێمن، هەژار هاتەوە

ئەوینی «پەشێو» بەهاری وڵات<br>
سەر لە پێناوی دڵدار هاتەوە

شاهین شاری ئیسفەهان ـ ١٣٦٤/١٢/١٥

# گەنجی و پیری

لە خەو راچەنی بە لۆرەی شەماڵ
بیرێ کە پیری تەزانی لە چاڵ

گەلێ تێپەڕی بە سینگی شەپۆل
کەوانەی دەدا گوزاری لە یاڵ

هەواری بەتاڵ سەرنجی پسان
هانای هەناسەی هاتۆ بەرەو ماڵ

پڕشنگی تەڕی بزەی لاوەتی
ترووسکەی دەهات لە نووکی خەیاڵ

منیش کوڕێ بووم لە ریزی کوڕان
تەمەن تێپەڕیو «شەش و نۆ» بە ساڵ

وەستای هەورگەر نەخشینی کردم
بە تاو و لووسی تەتەڵەی جەماڵ

تووتاڵی سەرم تەوانجی ئەدا
لە ئاوریشمێ دەرکشێ بەتاڵ

هــــــەنگوینی چـــــاوم دیــــــــــدەی کچـــــانی
گــــــڕووگر ئـــــەدی بــــــە گـــــوێرەی منـــــاڵ

بـــــۆ تاڵـــــانی دڵ بــــــە دوامــــــا ئـــــەهات
چــــــەنێ چـــــاوی رەش چــــــەنێ چـــــاوی کـــــاڵ

دەســــــــتی بـــــــە هێـــــــزی شــــــەوانی ژوان
تێکـــــــی دەهــــــاڕی بــــــــەرموور و خرخـــــــاڵ

بەڵــــــگەی بـــــــــــــەیانم پیرێژنێکـــــــــــە
مابــــێ لـــــــە جەزبـــــە و نــــــەچووبێ لـــــە حـــــاڵ

جـــــوانی پــــــەریوە خۆشــــــی خــــــەوێ بـــــوو
یـــــــادی بــــــــــەخێرە خـــــــەونێکی مــــــــەحاڵ

رۆژانی پـــــــیری کــــــۆلیلم بــــــــــــە غــــــــەم
گــــــەنجی هەڵــــــفڕی بـــــــە شـــــــاپەڕی بــــــاڵ

ئێســـــــــتاکە پــــــیرم زۆرن بـــــــــــە دوامـــــــۆ
بـــــە جێـــــی چـــــاوی رەش چڵــــەی چـــــاوی داڵ

دەســــــتم دەلـــــــەرزێ و دەڵــــــەی لێــــــی دەدەن
لــــــە ســـــیم و کــــــونی یۆڵـــــۆن و شمشـــــــاڵ

دووکــــــــانی ســــــەری ئاوریشـــــــم فــــــــرۆش
لــــــە مــــــوو بـــێ بــــە شـــــەو خەڵــــوەت و بـــــەتاڵ

تووچێنی چاوم پڕ دادەچێنێ
لە سیمای سپی دانەی ڕەشی خاڵ

سەرنجی پیریم لە جوان ئەبینێ
بێزاری لە سەر سیمای سڕوتاڵ

هەر چەن کە خۆشی باڵی هەڵوەری
دەبێ نەسووڕێ زمانی سکاڵ

منداڵی دڵم لە کۆشی پیری
بۆ ئامێزی جوان دەکا گڕوگاڵ

«پەشێو»م بەڵا دڵی تەڕ دەڵێ
هەتا نەدوورن سیپاڵی متقاڵ

دەبێ بدوورم هەتا دەمێنم
دیدەی سەرنجم لە چاوی کەژاڵ

بۆکان ـ ١٣٧٠/٩/٢٧

# کۆچ

گوزاری دا لە سەر بیری مناڵێ
گڕوگاڵی گوڵی سووری جەماڵێ

شەوی بەختم تلووعی دا کە ئەنگووت
لە ئاسۆدا هەتاوی کەزیە کاڵێ

وزەی هێزێ نەبوو بۆنی گوڵی کەم
بەسەر گوڵدا کشا هەژگ و بژاڵێ

زڕەی زەنگ و زەڵەی کۆچی تەتۆ بوو
هەشی دووری لە چاوم دا چەپاڵێ

بەرەو ماڵی سڕ و چۆڵم گەڕامۆ
پڕی بۆنی گوڵی تۆ بوو لە ماڵێ

هەموو شوێنێ وە دووی ئەو بۆنە کەوتم
گزینگی کەوتە پارێزی گەڕاڵێ

لە بەر ئاوێنەکە تیشکی گڕێ بوو
دڵی گرتم لە سەر حاڵێ بە حاڵێ

کە دیتم بۆنی ئەگریجە و قژی تۆن
لە ئامێزی بڕس بوو تاقە تاڵێ

هەڵم گرت و لە سەر سینگ و دڵم نا
دەبوو تاڵی دڵم لەو تاڵە هاڵێ

بەڵا چبکەم لە سینگمدا نەمابوو
دڵی بردم لە گەڵ کۆچی کەژاڵێ

هەڵی گووشی لە گەڵ هەستم فڕیدا
بزەی کوشت و حەواڵەی دا بە چاڵێ

بەهارە و بولبولیش سرتەی ئەوینی
لە گوێی جووتی دەدا، سروەی شەماڵێ

لە پێناوی ئەوین جووتن مەل و مۆر
مەلی ئەشقی ئەتۆ تەنها دەناڵێ

بەڵێنی بوو لە باغم تاوسێ بی
شەقەی هێزی وەفا بێنە لە باڵێ

زەمانی چاوەڕێ ژاری لە مارە
بەتاڵی وا دەچێ ساتێ بە ساڵێ

ئەمن ئاوا ئەوینی تۆ گڕی دام
ئەتۆ چۆنی گوڵی شۆخی مەحاڵێ؟

ئەتۆ دایم کەوا نەخشی خەیاڵی
دەکەی تاوێ لە من بیر و خەیاڵێ؟

بە هۆی دووری کە ژارم پێ دەچێژی
هەتا کەی وا بچێژم تامی تاڵێ؟

«پەشێو»ی پەلکەزێڕینی جەفاکار
بەرەو گەردوون دەبا دەستی سکاڵێ

بۆکان ـ ١٣٧١/١٢/٣

# گوڵاڵە

نەمامی هەستم سەوز و بەراوە
ئێخەی کراسی خونچەی کراوە

باغەوانێ بووم بۆ ئەو نەمامە
نە شەو وچان و نە رۆژ حەساوە

بە دڵ پەروەردە خۆشەویستێکە
ریشەی لە ریشەی جەرگم چەقاوە

سەرخۆش و مەس بووم لە کاروبارم
خەڵفی ئارەزووم بەری هێناوە

رۆژێ روانیم ئەو نەونەمامە
سەری نخوونە و رەنگ بڕووسقاوە

وتم گوڵاڵە رەنگت پەڕیوە
کوا عەتر و عەبیر جارانت ماوە؟

سووری سەروچاو بەرزی دیمەنت
بۆچی لە بەرچی وەک نوون چەماوە؟

وتی خۆشەویس یاری خەمبارم
مانوو بە قەول و شەرت و وەفاوە

گوێ رابدێرە بۆ بەسەرهاتم
راسی بەیان کەم چیم لێ کراوە

غورووری جوانی غافڵ بووم لەوەی
خەزانی ژینم وا دێ لە لاوە

شەختەی سەرماوەز رەنگی پەڕانم
کەوا سوورابیم لە روو بڕاوە

لە باغی تۆدا زۆر بێ سەمەر بووم
نەمزانی کەڵکم گوڵ و گوڵاوە

کزەی خەزانی پایز بردمی
وا بە جێم هێشتی عومرم تەواوە

بەڵا پەیامم بەرە بۆ گوڵان
تا گەش و بەشن ماون وە پاوە

بڵێ بە نەسرین هەڵاڵە و سۆسەن
بە شەوبۆش بڵێ مەستی شەواوە

هەر وەها نەرگس لە بیرت نەچێ
زەنگی کۆچ و بار ئەونە زریاوە

بە لالە و بەیبوون گەزیزەش بڵێ
گەشاوەی نەشەن وە دەم چیاوە

بـــە زەرقـــە و برقـــەی لاویـــی نـــەنازن
جـــوانی بـــۆ کەســـێ تـــا ســـەر نـــەماوە

لـــە دەســـتی نـــەدەن دەرفـــەت و هـــەلێ
دەرفـــەتی تـــۆراو ئـــاخی بـــە دواوە

بـــە فیـــرۆ نـــەچێ ژیـــنی ئـــەوانیش
گـــوڵ بـــدەن بـــە گـــەل تـــا بـــۆنی بـــاوە

ســـووک و ئەســـپایی بچـــۆ پێشـــەوە
بڵـــێ بـــەو گوڵـــەی وەنەوشـــەی نـــاوە

بـــۆ ناهومێـــدە و کـــەچ دەکـــا ملـــی؟
دەبـــێ بـــزانێ ئەگـــەر شـــیاوە

خزمـــەتی خەڵـــکی هـــەر کـــەس پیشـــە کـــا
ماڵـــی بـــەهەشتی بـــۆ دەق دراوە

بـــۆ «پەشـــێو» دایم ویـــردی زمانـــە
خەڵـــکی دڵـــخۆش و تێـــر و حەســـاوە

تیکانتەپە ـ ١٣٤٨/٩/٨

# هەڵاڵە

چەندە خۆشە هەر بەهارێ دێتەوە لەو یاڵە بام
تێکەڵی بۆنی هەڵاڵەی ئەو گوڵاڵە ئاڵە بام

سۆزی بلوێری بەهاری بەیتی رزگاری دەڵێ
چی دەبوو ساتێ شەپۆلی سۆزی ئەو شمشاڵە بام

تا لە ئەستۆی تۆ دەهاڵێ تاڵی کەزیەی دڵگرت
سەد کەڕەت خۆزگەی دەخوازم تێکەڵی ئەو تاڵە بام

دەمگەزی ئەو کوڵمە ئاڵەی بێ ئەوەی ترسم هەبێ
ماری کەزیەی پاسەوانە گەر دەمی ئەو خاڵە بام

تاسەبارم بۆ ژوانێ لەو کەژانە وەک هەڵۆ
دەنگی باڵم ئاژوابا شەوگەڕی ئەو باڵە بام

ئەو کەسەی وا بۆ ریا بەرماڵی نوێژی رادەخا
ئەی دەبریا بۆ قەپۆزی مستی ئەو بەرماڵە بام

مەی دەڵێن مەستی دەهێنێ لادەبا فێڵ و ریا
خۆشە عەمرێکی هەزارە مەستی ئەو ئەحواڵە بام

گەر بە شۆفاری نەسووڕابا زمانی دوو زمان
کەی بڕا کووژی رەوا بوو تا «پەشێو»ی ناڵە بام

١٣٧٧/٢/٢٩

بۆکان